# چەپکە گوڵ

چەند پارچەیەک لە شیعرەکانی :

## شامی «کرماشانی»



## شامی کێیە؟

لە گەڕەکی چەنانی شاری کرماشان، پیاوێك دەژیت کە بەگشت دەس‌تەنگیو نەداریو بێدەستەڵاتیەوە، زۆرتر لە کوردزمانان، بەبۆنەی شێعرە جوانەکانیەوە، دەیناسنو خۆشیان ئەوێ.

شامرادی مُشتاق، کە ناوبانگی بە «شامی» دەرچوە، دەوری شێصت ساڵ لەوەو پێش، لە کرماشان لەدایك بوە. سێ‌ساڵان دەبێ، نەخۆشی ئاوڵە دەگرێتو بەهۆی ئەو نەخۆشیەوە، هەرتك‌چاوی کوێر دەبنو وا بەمنداڵی دنیای روناکی لێ تاریك دەبێت.

خۆی دەڵێ:

هەنوز نەشناسوم چەپو راسِ دەست
دەستِ جەهاندار جەهانبینم بەست

پاش کوێربُونی، زۆری نەخایاندوە، باوەشی گەرمی دایکیشی ـ کە شامی جاروبارە تێدا ئارامی گرتوەو بۆدەمێك خەمی دنیای تاریکی دەوروبەری لەبیر بردۆتەوە ـ سارد دەبێتەوە. چونیەتی ژیانی تاڵی لەوەو پاشی، دەبێ لەخۆی بژنەوی.

تەمەنی عومری دەوازدەساڵ زۆرتر نەبوە، کە باوکیشی عومری خودا دەکاو ئەمجار لەسەر هەمو دەردان، رەنگی هەتیویشی لێ دەنیشێ. دوای فەوتی باوکی، ماموژنی دەیباتە لای خۆیو پاش ماوەییێك دەینێرێ بۆماڵی «حاج امان‌الله مُعتضدی»و لەوە بەولاوە ئەوپیاوە چاودێری لێ‌دەکات تا گەورەدەبێ.

لەو رۆژگارە، رادیوو تلویزیون نەبوە. مەردم ـ بەتایبەت زستانان ـ هەرشەوێك

لەماڵی یەکێك، کۆوە دەبون و شیعریان دەخوێندەوەو قسەی خۆشیان دەکرد.
شامی دەیگێڕێتەوە: لەوکاتەدا شیعری «مەلا ئەلماس‌خان»و «غُلامرضا لوڕ»و «سەید صلاح»، زۆر باوبو. منیش زۆرم حەز لێ‌دەکردن و جوانم گوێ بۆدەگرتن. کەم‌کەم وام لێ‌هاتبو، لەزۆر شوێنان ئەگەر لەتی ئەوەڵی شیعرەکەم دەبیست، بەزەوق باقی شیعرەکەم پێ‌دەزانی. بەوبونەوە تێ‌گەیشتم کە بۆخۆشم دەتوانم شیعربڵێم.

هەر لەو سەردەمانەدا، لەماڵ ئەمان‌الله خان دێتە دەرێ‌و بۆخۆی کارو کاسبی دەس‌پێ دەکا. چای‌و پارچەو وردەواڵە لە قصرشیرین دەکڕێ‌و لەکرماشان دەیفرۆشێ. ئەگەریش جاروبار ئەمینەو ئاژان رێیان پێ‌گرتوە، بە دوقسەی خۆش‌و چوارشیعری جوان، لەکۆڵی بونەتەوەو خەلاسی هاتوە. بەم‌جۆرە لە رەنجی خۆی، تیکەنانێکی وەدەس خستوەوە بەوەژیاوە.

شامی بەهەمو بێ‌دەستەڵاتی‌و دەس تەنگیەوە، زۆر بەرچاو تێرەو قەت‌نانی ناپیاوی تام نەکردوەو دەستی خوازەڵۆکی بۆهیچ کەس دانەکێشاوە. ئێستاش ماڵوکەیەکی هەیە، کە دوسێ وەتاغی بەکرێ داوەو بەوەدەژیت.

لەوەی کە عومری دەڵێ، پیرتر دیارەو بەداخەوە نەخۆشیش زۆری بۆهێناوە. خەڵکیش قەدری نازانن‌و کەمتر هەواڵی دەپرسن. تەنانەت جارێك ناپیاوێك شێعرەکانی لێ‌ساندوەو کوتویە بوتی چاپ ئەکەم، کەچی بردویە دزیویەو بەناوخوی لەچاپی داوە.

خوی دەڵێ: لەسەرینەی هەمو ئەوانە، شێعری زۆرم کوتوە، کە کەسی وا نەبوە پێ بڵێم بیان‌نوسێتەوەو خوشم لەبیرم نەماون‌و هەروا رویون‌و فەتاون.

بەو ئاواتە کە بتوانین باشتر لەرابردو شاعیران‌و نوسەرانمان بەخەڵك بناسێنین خەڵکیش زورتر لەپێشو، بەوجورە کە حەقی‌خویە، قەدریان بگرن‌و نەیەڵن هەروا بێ‌ناوو بێ‌دەفتەر، لەبەین بچن‌و پاش نەمان‌و فەوتانیان، ئاخو حەسرەت‌مان بو بمێنێتەوە.

جا ئێستا چەند پارچەیێك لە شێعرەکانی ماموستای نەخوێندەوارمان «شامی» بەخەڵکی پێش‌کەش ئەکەین.

ئەوەی کە جێگایە لەیرەدا بگوترێ، سپاسی زورە لە «کاك حسین مُفتی»؛ کە بەراستی ئەگەر ئەو لەم‌کارەدا یاریدەی نەدەداین، دەبێ بڵێی نەدەکرا.

بەئاواتین لە هەرکوێ دەبێ، سَعادَتمندو سەرکەوتوبێ.

کومەڵە شیعری «شامی»، کوردی کرماشانیم خویندەوە. دەگەڵ هەر شیعریکیدا، بزەم دەهاتە سەر لێوان و، کزەم لەجەرگەوە دەهات. زەردە خەندەم دیت، بەسەر گریان هەڵکیشراوە. خەمو مەینەت، بەبێژنگی گەپو گاڵتە، دابێژراوە. هەناسەی سارد، لە دڵێکی گەرمو بەکوڵ هاتوتەدەر. ژەهراوی تاڵاوی ژیانی پرلەژانی چارەرەشێك، کەفی گەمەو تیز بە دنیایە کردنی، هاتوتەسەر.

ئەوی راستبێ، تا خوا حەزکا شیعرەکان تەڕو پاراونو لە نرخێکی زۆر رەوانو لەبارو جوان، خەبەر دەدەن. تەنیا عەیبیك کە پیاو بەچاو هەستی بکا، کوردیبونو کوردبونی شاعیرە کەیە؛ کە بە ناشکوری خوا نەبێ، کوردیو کوردبون لەبازاری دنیا پولەسوتاوێکیش ناژیو کەس ئاوڕی لێ ناداتەوە.

شامی سەرەڕای کوردبونیش، تەنیا چاوی دڵی رونەو لە سەرەتای ژیانیەوە لەبینایی بەشبڕاوە؛ هەزارێکە هیچ ئاشتەبای خوا شكنابا. شانی هەر پێستو ئێسقانی داوەتە بەر گرانایی باری ژیانو لە تاریکی شەوە زەنگی چارەرەشیو دورەبەشی، دەستە کوتەو پەلەقاژەی بژیو پەیدا کردنیەتی. ناوی ژیانی بەڕەحەتیو ئاسودەیی، جارجار لەدەمی خەڵکەوە بەگوێ گەیوە، بەڵام هێشتا نەیزانیوە شادی بەری چدارێکەو لەوەڕی چهەوارێکە. واتا: ئەگەر تاوانبارانی ئاسایی، لە زیندانیکدا دەگیرێن، شامی شاعیر،لەسێزینداندا گیراوە. لەگرتوخانەی بێچاوی، لەزیندانی بێنانیدا، لە بەندیخانەی حەستەمی کوردزوانیو کوردرەسەنی، چوارپەلی شەتەك دراوە؛ قەڵەمی ئەژنۆی شکاوە؛ دەمی قسەی ئاخنراوە؛ دەرەتانی لێبڕاوە؛ عاسمان دورو زەوی سەخت، بەکام کەلێندا دەرکەوێ؟ چۆن

بتوانێ پەل‌بیزێوی؟ چۆن دەنگ بڵندکاو هاوارکا؟ ئەوسا ئەگەر هاواری‌کرد، کێ تێی دەگا؟ یاکێ بەهاواریەوە دێت!؟. خۆ ئەگەر جاروبارەیەك دەردو زوخاوی ژینی خۆی، بە چەندشیعرێك دەربڕیوە، کەس‌نەبوە زەحمەت بکێشێ‌و بۆی بخاتە سەرقاقەزو لەناو نەچێ. ئەو چەندشیعرو هەڵبەستانەی لەم نامیلکەدا کۆوەبون، هەرئەوانەن کەخۆی بەرێ، لەبەری‌بون‌و لەبیری نەچوبونەوە. خوداماڵی کاکەماجدی روحانی ئاوەدان‌کا، کە فریای ئەم‌کەمەش کەوتو لەچاپی‌دا.

ئەگەر شامی سەربەگەلی کورد نەبوایە، ئەگەر هێندە بێ‌کەس‌و هەژار نەبوایە، ئەگەر لەبەهرەی بینایی بەشی‌بوایە، ئەگەرو ئەگەرو ئەگەر... ـ کە بەداخی گرانەوە، هەزاران ئەگەرو خوزیا هەرگیز هیچیان لێ شین‌نەبوە ـ لێم‌رونە ناوبانگی شیعری لەزور ئاقاران دەبیسرا.

بەبڕوای من، هەر تەنیا ئەو پارچەشیعرەی کە دەربارەی «کرانشینی» داینا‌وەو ژیانی چینی لێ‌قەوماوی، بەختەو ئیقباڵ وەرگەڕاوی تاڵەرەش‌و ژیان‌تاڵی بێ‌سەرو سامان‌و ناهومێدو کەس‌نەناس‌و سەرلێ شیواوو کەساسی، بەوجورە وێنەکێشاوە، باشترین گەوای هونەرو هونەرمەندی‌و دەس‌رەنگینی‌و شیعر جوانی‌و رەوانی شاعیرێ هەڵکەوتەیە.

با لەخوا بپاڕێینەوە کە شامیش‌و خزم‌و کەسی هاورەسەنی، لەژیانی دیلی‌و زەلیلی‌و دڵبرینی‌و هیچ نەبینی‌و بێ‌ماڵی‌و کرانشینی، رزگاربین‌و بتوانین‌و بەراشکاوی، کرو هونەری هێژامان ئاشکراکەین‌و بیدەینە بەرچاوی تیژی گەلانی خوداپێداوی ئەم‌جیهانە. آمین.

**هەژار. ٦٢/٩/٢٨ ـ تاران.**



وه کامِ کەس نیگە بوو چەرخُ ناتەبار
نە درویشم نە سُولتانم فلکە!



روزی که من بیم وەمادەر پەیدا
قەومان وە شادی وەختبی بون شەیدا

شوکر خوداوەند وەجا ئاوەردەن
جەشنی وەشادی من بەرپا کەردەن

شەو یازدەهوم ساعەت کەردەن خوەش
ناو بەندە نان «شامی» ستەمکەش

تامن واردبیم وەی مهنەتسەرا
وەی دونیای پورجەور پور وەماجەرا

هەنووز نەشناسوم چەپو راس دەست
دەست جەهاندار جەهانبینم بەست

سێ ساڵەنیمە تفڵ خاروزار
مادەرم وەدەرد سەختی بیدوچار

شەش ماهِ تەمام وەبانِ جابی
عاقبەت دەوای دەردەش فەنابی

من‌مه‌نم ئه‌ڕای جه‌فای زه‌مانه
په‌ی تیر ته‌ءنه‌ی خیش‌و بیگانه

له به‌عده‌ز ده‌ساڵ فه‌وت ماده‌رم
خاك یه‌تیمیش رشیاده سه‌رم

**زمسان ١٣٢٤**



یەی‌شەو دڵگیربیم لە دونیای دورەنگ
وەگەرد تاڵەی ویم مەکەردم جەنگ

واتم: ئەی‌تاڵەی شووم کەجبنیاد!
بەربادبای، عومرم تودای وەبەرباد

نیەزام ئەی‌تاڵەی تیرەی واژگون
تاکەی سەرگەشتەم کەید وە دونیای‌دون

تاکەی تەقالا تاکەی بەردەڵبەرد؟
تاکەی بکیشم وەدڵ ئاهِ سەرد؟

دڵ تاکەی بیزار لە زندەگی‌بوو؟
روح تاکەی خەستەی دەوەندگی‌بوو؟

تاکەی وەئەفسووس بسام دەس وەدەس؟
تاکەی بشنەوم ناخاس وەناکەس؟

بەدیم چەس؟ گەردوُن بەدکرد وەگەردم
تاکەی خوێن دڵ مەدەی وەخوەردم؟

دادبکەم تاچەند خوین‌بخوەم تاکەی؟
تاکەی بکیشم ئاهِ پەی‌دەرپەی؟

تاکەی بارجەور مەنەی وەشانم؟
ئەیوب‌نیم وەی‌تەور کرد ئەمتحانم

رەنجم بی‌سەمەر سەودام بی‌سوُده
کەردەم نەکەردەو بوودم نابوُده

لەسەر دوراهەی زندگی گیرم
بەربادەو بی‌سوود نەقشەو تەدبیرم

نەمەرگم پەیداس نە زندەگانی
بلاتەکلیفم لە دونیای فانی

وەدەرد چەم‌خوەی زندگی وە زەجر
نەدین نەدونیا نەعوقبا نەئەجر

چەبوشم چەکرد گەردوون وەگەردم
یەی‌تەن موبتەڵای هزاران دەردم

مەرمن وەجوملەی نوع بەشەر نیم؟
یەی‌دەم بی‌غوسەو بی‌دەردسەر نیم

بیەیده بانِ سەر وەهەر دوودەسی
دادبکەی وەدەس جەورِ بی‌کەسی

قەوم قبلەس وەلی قبلەی‌من چەفتەن
هەرچی قەوم دیرم دوُر وەلیم کەفتەن

قورئان لەعنەت‌کەی وەقەومِ زاڵم
کەس وەدڵ‌سوُزی نیەپرسی حاڵم

هەرکەس پول‌نەیری خەڕگی خەسە
سەرکیشی کەری پەخشەو مەگەسە

چراغِ باڵین شەخسِ بیچارە
بی‌نَەفت خاموُشە هەر لەئیوارە

چوار ئسکان چرك نریاسە شانی
یەی‌خاکەناز توُز نشیەیدە بانی

نە دوست یەی‌رەنگ نەیار غەم‌خوار
خیش‌و بیگانە لەنورەش بیزار

خیش‌و بیگانە لیش مەکەن دوُری
سەروەلیش نیەن مەر وەمەجبوری

لەو روُژە ترسم یانەی کە ئەرزکەم
لەوئاخرکارە گشت بای وەڕی خوەم

یارەب! وەحورمەت شاهەنشای شاهان
نگەهداری کەر وە بی‌پەناهان

پەنام هەر خوەدی هەر وەخوەت قەسەم
وەزات بی‌عیب «مُحمّد» قەسەم

وەئال ئەبا وەپەنج‌تەن قەسەم
وەدەر وەقەلعەی خیبەرکەن قەسەم

وەشاه مەزلووم، تشنەلەب قەسەم
وەسەقای شوجای بائەدەب قەسەم

وەئاهِ بی‌کەس خاروزار قەسەم
وەدیدەی وەدەر انتظار قەسەم

وەسووز سینەو ئاهِ سەرد قەسەم
وەشامِ تیرەو رنجو دەرد قەسەم

وە دەرد پنهان دەردەدار قەسەم
وەشەرمەندگی کوڵفەت‌بار قەسەم

وەجیب خالی رنگِ زرد قەسەم
وەشانِ رەنجبەر پڕوەگەرد قەسەم

وەقەلب شیرین دڵ‌ناشاد قەسەم
وەزور فەرهاد رەنجوەباد قەسەم

وەرنجو مهنەت دنیای‌دوون قەسەم
وەتاڵەی تیرەی واژگون قەسەم

وەرنج دنیاو مەشەقەت قەسەم
وەروح خەستەی ناراحەت قەسەم

وەئاهِ سینەی بی‌ئەسەر قەسەم
وەتاق بی‌جوفت دەروەدەر قەسەم

وەجادەی خیاڵ کوەغەم قەسەم
وەدەریای مهنەت قەلب خوەم قەسەم

وەسەرچشمەی چەشم چشمەی دڵ قەسەم
وەسەحرای دامەن بی‌حاصڵ قەسەم

وەتاڵەی تیرەو پاسی‌بەد قەسەم
وەبەختِ خوفتەی بیش‌وەحەد قەسەم

وەئەشك دیدەی نائومید قەسەم
وەئاهِ پیران موسفید قەسەم

وەنەسیم سوبح پیش‌ئەز خوەر قەسەم
وە سەوت قورئان روح‌پەروەر قەسەم

وەرتبەی پاکان دامەن‌پاك قەسەم
وەحوورو مەلەك وەئەفلاك قەسەم

وەچەندین هەزار پیغمبَر قەسەم
هەرخوەت داوەری وەداوەر قەسەم

وەر نەکی دڵسوُز کی غەم خارمەن؟
کی وەبیماری پەرسدار مەن؟

مەریزبووم کامقەوم تیەیدە دیارم؟
کام دڵ مەسوُزد وەحالِ زارم؟

کام دوسِ یەی رەنگ کام فامیل کام کەس؟
کی‌پرسید ئەحواڵ شەخسِ توهی‌دەس؟

لەدونیا بەری وەگیان بیزارم
ئەجەڵ باو بوەرەم بچمە پەی‌کارم

دڵ وەزەمزەمەی زندگی سیرە
ئەجەڵ ئیمشەوباو فەرداشەو دیرە

وای وە بەدبەختی داد وە ناکامی
دەردڵ فرەس کوتاکە «شامی»

ثابتبی وەمن لەی روزگارە
هەرکەس دەردخوەی وەخوەی دیارە

**پاییز ١٣٢٥**



در گذشته سنگ نمک را در هاون سنگی می‌کوبیدند تا به‌صورت پودر درآید و قابل استفاده شود.

شامی خود را به قطعه‌سنگِ نمک، هاون را به دنیا و دسته هاون را به عذاب دنیا تشبیه کرده و چنین گفته است:

گر بر سر من سنگ بکوبی ای سنگ!<br>
از طالع خویشتن نگردم دلتنگ<br>
سنگم، به سرم سنگ جفا می‌کوبی؟<br>
ای سنگدل سست وفای همه‌رنگ!

**تاوسان ۱۳۲۶**

# کرانشینی

(١)

بەندە یەی نەفەر کرانشینم
چو عەزیزمردی دایم غەمینم
نە خارج مەزەب نە جوداس دینم
ئەر دوعات گیراس، بکەر نفرینم
شایەد لەی دونیا دیتر نەمینم
ڕاحەت‌بوم لەدەس کرانشینی
چەبکەم لەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی

(٢)

توای بزانی، سەگ وەحاڵم نەو
ئاسایش نەیرم، نەروژو نەشەو
صوب تائیوارە هام لە تەق‌و دەو
تا سەر مانگ‌بای دوتیکە ئەسپەو
یا بەم فروشم، یا نەمە گرەو
ئوشم کراکەم بەڵکە نەمینی
چەبکەم وەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی



(٣)

ژنەم جاروکیش خوەم قاپچی دەرم
وە فصلّ زمسان وەفر پاکەوکەرم
لەعەیش‌و عەزا چو سەماوەرم
خوەیان چوو ئاغاو بەندە نەوکەرم
ئەرمەنیان نەکەی، دەنە ناو سەرم
ئوشن: گوشتِ‌گەن ئەڕامان سینی
چەبکەم وەدەس کرانشینی؟
داد وە هەرکەس بەم، حەقم نیەسینی

(٤)

یەی هەفتە مینیت مانگ‌بچودە سەر
ژنِ صاحێومالّ دەس‌نیەتە کەمەر
وەژشتی تەمام تێتە پشت دەر
لەوەرپای هەڵسم چو ئاغاو نەوکەر
وەژنەم ئوشم دەم‌کەر سەماوەر
خوەم دەوم ئەڕای میوەو شیرینی
چەبکەم لەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی



(٥)

یەی کوڕێ دیرن چو وەچکەی شەیتان
صوب لەخاو هەڵسێ تێتە ناو ئەیوان
وەجیبی پڕریخ دەس وە تیرکەمان
خەیت ئەڕای قوڕی، خەیت ئەڕای اسکان
سیوڵ جافر گریتە نیشان
کەس جورەت نەیری سەدای بایدەبان
بوشی جوانەمەرگ سەرم نەشکینی
چەبکەم وەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم حەقم نیەسینی

(٦)

داراییم بیەسە چوار دوێتو یەی کوڕ
دو پەتوی نیمدار، یەیجوفت لافەشڕ
یەی جوفت متەکای وەدەم قەیچی پڕ
سەر نیەدە بانی، چو پارەئاجوڕ
سەری گەنکەفی تیەیدە خوڕەخوڕ
چوارجام روحی، یەیدانە سینی
چەبکەم لەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی



(٧)

زانی چەن نەفەر هایمە یەی حەسار؟
من ئۆشم پەنجا، تو بوش: پەنجاو چوار
دریژو کوتا، کاردارو بی‌کار
سوب لەخەو هەڵسیت، لەگوشەی حەسار
بیس‌نەفەر وساس، تەك داسە دیوار
حەقدە ئەفتاوە نریاسە قەتار
بایەد پەی نەوبەت بلیت بسینی
چەبکەم وەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی

(٨)

سەرشەو تاسوب هەر جیرەی دەر تێد
مەشەی غوڵام چوت، ئوسا سەفەر تێد
کەلای فەرۆخ خان لە دینەوەر تێد
ئوسا ئەمیرخان‌گەرد چوارخەر تێد
مەرافە دیرن، ئەر دەر واز مینی
چەبکەم وەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی



(٩)

بازوم وەغوسە بیەسە باڵ سەگ
ئیقبالم پەستتر وە ئیقبالِ سەگ
هاتم وەی دونیا من وەساڵ سەگ
هەرشەو نیەخەفم من وەقاڵ سەگ
نسم شەو ئوشم: خوەش وەحاڵ سەگ
نە کراماڵ دەید، نە پاڵتاو سینی
چەبکەم وەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی

(١٠)

جەرگم سوراخە چو لانەی زەنبور
بەسکە شنەوم قسەی جوروا‌جوِر
روحم دی خەستەس وەفەرمانِ زور
وەکوڕەم ئوشم: خەڕبیشعور
سوب لەخەو هەڵسی، صورەتت نەشور
لەی ئاو لولە فرە ڕشنی
چەبکەم وەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی



(١١)

ئوشن هەرڕۆژی دیزە نەیتە دار
خوا ئەڕای شام بو، خوا ئەڕای نەهار
خوا گوشت گاپیر، خوا شەكِ پەروار
گوشت کوتانەکەی بوەیتە دەر حەسار
یواش بکوتی، نەرمنی دیوار
لەناو حەساریش ئاجور نەشکنی
چەبکەم لەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی

(١٢)

وەهەولّ گیانم نەونە دوشمنم
شایەد نەشیۆیت لانەو مەسکەنم
عەزیزم مردویت، وەدەمیان خەنم
ئیمریکایی ڕەقصم، ئینگلیسی ژەنم
چو ئاغای ویگن، پەنجاجور خوەنم
ئەربکەن نفرین ژنو فەرزەنم
خوەمیش کومەكـکەم ئوشم: ئامینی
چەبکەم لەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی



(١٣)

بەس‌کە کرادام لەی‌تەویلە چوخەر
عومر وە بەدبەختی هاوردم وەسەر
بیمەسە مونس چەن‌گرو بەشەر
لوڕ لە لوڕستان کورد لە دینەوەر
سنەیی‌و پاوەیی جاف‌و کەمانگەر
کوردو لوڕو فارس، تورك قەزوینی
چەبکەم لەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی

(١٤)

نە پەست‌و ناکەس، نە نادەرویشم
شەرمەندە لەڕوی بیگانەو خویشم
نە کەس تێتەلام، نە لای‌کەس نیشم
خوەیان هەرشەو چن، من کیشك کیشم
ئەردیر دەر واکەم، نەمنە ڕێشم
منیش ڕەگ نەیرم چو سیف‌زەمینی
چەبکەم لەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی



(١٥)

یەی‌شەو دونەفەر بینە میمانم
نیم‌ساعەت بیشتر لەبەرق سوزانم
سوب بینە ئاگر ڕشیانە گیانم
ئاغای صاحیوٚ ماڵ وە گەرد خانم
ئاو پاشینە بان تەپڵ ئامانم
هەم لافە شڕە دریا وەشانم
وتن: تاغروب لەیردا نەمینی
چەبکەم وەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی

(١٦)

ئەڕای بەدبەختی، نیامەی‌و نەهات
یەی قەومی دیریم، هاتو لەدهات
گاهەس بناسی کەی‌خودا بەسات
یەی کەڵەشیری هاوردوە سەوقات
شەفەق صاحیوٚ ماڵ، هەم دەنگی دەرات
پوپەکەو بگری! بەسکە قولنی
چەبکەم وەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی



(١٧)

دوێکه چیم بگرم، ئوطاقیك لەجای
وتم بکیشم، بیلًا دەنگم نای
کەمکەم چیم لەدەر ماڵ مەشەیموڕای
یەی عفریتی دیم، وەڕیوارت نای
دەمامەی جادو نیەرەسێت وەپای
مەر فولادزرە بوتە قەرینی
چەبکەم وەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی

(١٨)

چو کاوڕ وەگورگ، لەلی ڕەم کردم
یەیپا هاتە وەر، سیٚپا دورگردم
وەهەوڵ گیانم سڵامی کردم
ووت: کاری داشتی؟ ناو ئوطاق بردم
ووت: تۆسرکانیت؟ ووتم: نە کوردم
ووت: کورد کورەیت؟ ووتم: هەرسینی
چەبکەم وەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی



(١٩)

ووت: چەن نەفەرین؟ ووتم: دەنەفەر
غەیرلە ڕۆبابەو عەمە ماپەروەر
زوبەیدەو ملوك، نوسرەتو کیشوەر
نیمتاجو تاجی، عشیرەتو خاوەر
کوڕە بوچکەڵەو خوەمو ژنی

چەبکەم وە دەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی

(٢٠)

چوپشی لەشون بوی پیازداخ
یەی هەفتە کردم ماڵ وەماڵ سوراخ
لە «سەنگمەعدەن»، تا «چوارڕای ئوجاخ»
«تیمچە»و «چەنانی»، تا «بەرزەدەماخ»
کەس وەپیم نەیات، یەیدانە ئوتاخ
وەدینت یەسە ڕەسم هاودینی؟!

چەبکەم وەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی



(٢١)

یەی فەرشی داشتم، مینستە جل‌شاڵ
بابِ پاڵان‌بی ئەڕای یابو ئاڵ
چوار قیمەتِ خوی هەر داومە حوماڵ
هەفتەی یەی کوچە، چوارڕوژ وە یەی ماڵ
شانزدە ماڵ گەردیم وەعەرض. یەی ساڵ
دوێکە دامەی شان علی‌ئاغای دەڵاڵ
ووتم: یەیش بفروش نیەتوام بمینی
چەبکەم وەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی

(٢٢)

سێ‌مانگم پەس کەفت کرایەی خانی
یەسە، مانگی‌تر هات نیشتە بانی
باورو پیم نیەوت خودا خوی زانی
چشتی کە شك‌بەم مەجمەو قازانی
ئەوەیش دی نیەیلم ژنم بزانی
سوب هەراجی‌کەم نیەیلم بمینی
چە بکەم وەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی



(٢٣)

کەس خەوەر نیە، وەحالْ دەردم
گوشِ کەس نیە، وە ئاهِ سەردم
چلسالْ وەئیران زندگی کەردم
کرای زەمین دەم وەبانی گەردم
ڕۆزگار موحتاج کرد وەنامەردم
نە ڕۆمی ڕومیم، نە چینیچینی
چەبکەم وەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی

(٢٤)

قەلبم چو کورەی حەداد مەدەی جوش
لەدەسِ دونیاو خەڵكِ خاكفروش
دونیا زندانە پەی شەخص باهوش
ئایەم نەبایەد کەمتر بوت لە موش
ئەوەیش جیدیری لەناو پڕو پوش
موش نە کرا دەید نە کراسینی
چەبکەم وەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی



(٢٥)

ئوتاقی گردم بی‌بەرق‌و بی‌ئەو
دەروپەیکەر خویرد، چواردیوار خرەو
داغی پیرم کرد کردمە قولەو
روژ نیمەرو وەلیم کردە شەو
دی چەتوای وەلیم؟ ئاسمانِ کەو!
حەقِ من تاحەشر لەلات بمینی
چەبکەم لەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی

(٢٦)

لەڕوژی ترسم ئەجەڵ بدەی زەنگ
عومرم تەمام بوت لەدونیای دورەنگ
پنهان‌بوم لەژیر خشت‌و خاک‌و سەنگ
ژن ساحیوماڵ وەبیل‌و قوڵەنگ
قوڕەقوڕ کونان، وەقسەو جەفەنگ
بای کرایەی قەور لەلیم بسینی
چەبکەم وەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی



(٢٧)

سەرمانگ وەمانگ بایتە دیارم
وەبیل هەڵکەنیٚ سەنگِ مەزارم
بکەی شکەنجەو زەجرو ئازارم
بوشی کرادەیت یا پاسەبان بارم؟
منیش لە ئەلحەد سەرم دەرارم
دادبکەم هاوار، کەفەن کی سینی؟
چەبکەم وەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی

(٢٨)

چوسەگ وڵگەرد، دەروەدەر وەخوەم
شەو تاسوب نەخەف، ڕەنج بیوەر وەخوەم
دڵگیر وەدونیای دونپەروەر وەوخوەم
لەدەس ساحێماڵ خونجگەر وەخوەم
مشتی خاك نەیرم، خاك وەسەر وەخوەم
لەزیندەی ئایەم بیخەوەر وەخوەم
نیەزانم «شامی!» دی تاکەی مینی؟
چەبکەم وەدەس کرانشینی؟
داد وەهەرکەس بەم، حەقم نیەسینی

تاوسان ١٣٣٠

# دادِ ملەتِ ئیران وە دوکتور موسەدق

(١)

وەبەس کە گەردیم دەس وەبان دەس
قورب ئەڕام نەمەن چومیوەی نازەس
جواو سڵام نیەشنوم لە‌َدەس
بیکار چو ئیمە لەئیران فرەس
خوەش وەحاڵ هەرکەس مریت، ئاسوُدەس
دوکتور موسەدق تەکلیفمان چەس؟

(٢)

نیمی لە ملەت دوچار دەردن
لەسوب تاغوروب بیکار مەگەردن
وەگوسنەیی وینەی زەعفەران زەردن
مەرد مومبارز روز نەبەردن
زەڕ ئەڕای ئیوەو شەڕ ئەڕای ئیمەس؟
دوکتور موسەدق تەکلیفمان چەس؟



(٣)

نیمی لە ملەت چوگای پەرواری
هەرخوەن‌و خەفن لە سمن کاری
نەدەرد جوفت خوەن نەدەردباری
سەرمەستن وەجام بادەی بی‌عاری
هەمیشە هەفت رەنگ لە سوفرەشان هەس
دوکتور موسەدق تەکلیفمان چەس؟

(٤)

ئوشن چل‌هەزار بیکار لە پاتەخت
عومر گرامی مەگوزەرن وەسەخت
بی‌جاو مەکان بی‌لباس‌و رەخت
سیٚوەعدە غەزا کەردەن وەیەی وەخت
ئاخر ئەوانەیش هەم نەوع ئیوەس
دوکتور موسەدق تەکلیفمان چەس؟



(٥)

یەسە چوار رۆژتر هەم زمستانە
زوخالْ نابوده هیزوم گرانە
سدای زیل و بەم بەفروبارانە
چەقەی دنان تیەی چو مسگەرخانە
داش نانەوایی نیە کە فیدەدەس
دوکتور موسەدق تەکلیفمان چەس؟

(٦)

غوسەی کەسادی سفیدکرد ریشم
لەسوب تاغورب خەمیازە کیشم
من وە انتزار موشتەری نیشم
بازڕە سەیل هەرسات مەکەن تەفتیشم
چەبکەم ئەڕای تەڵەکەی بازڕەس
دوکتور موسەدق تەکلیفمان چەس؟



(٧)

موشتی زەڕ پەرەس سکەی زەڕشناس
هیچ دینی نەیرن غەیرەز اسکناس
مەمجلس ریا و رەوزه قەار داس
تانیشان بیەن ئەسپابو ئەساس
یە رەوز نیە، یەیش یەی جوُر حوقەس
دوکتور موسەدق تەکلیفمان چەس؟

(٨)

سیٚ ماهه حقوق پاسەبانِ شار
نیە رەسید نیەدەی دەسِ تەڵەبکار
مەرجورئەت دیرن بچنه بازاز
یەچڕەی ئاغا، ئەوداد کەی سەرکار
دەس مایە نەیریم حەساوەکەت بار
وەدینت یەرەسم نه قدو نسیەس
دوکتور موسەدق تەکلیفمان چەس؟



(٩)

ئەوزاع مەملەکەت دەرهەم بەرهەمە
وینەی زولف یارپور پیچو خەمە
نیمی لە ملەت دوچار غەمە
رشتەی زندگی خەیلی موحکەمە
وەرنە وەئاسان گیان مەدەن ودەس
دوکتور موسەدق تەکلیفمان چەس؟

(١٠)

دەستو پای مەردوم پیچیاس وەهەم
گش‌وە کە ساتی دوچارن وە غەم
لەهەر کەس پرسم ئوشی چەبکەم
وەگیان شامی هەر لە کیسەخوەم
من ئوشم بخوین تائەورەی کە هەس
دوکتور موسەدق تەکلیفمان چەس؟

## جواو دوکتور موسەدق وە ملەتِ ئیران

(١)

ملەت ئیران! ملەت ئیران!
ئەوەڵ وە یاری حەیِ لامەکان
وە دوعای سەحەر عەلامەی کاشان
وە بەخت‌و ئیقباڵ خەلق موسوڵمان
خواهەم ئاباد کرد ئیرانِ ویران
خودایاری کەی وەکار هەرکەس
لەمن نەپرسن تەکلیفمان چەس

(٢)

سەور کەین ئی‌چەرخە یەی دەور بخوەی دەور
قەوڵ دەم ئی اوزاع نەمینیت وەی تەور
بسازین وەگەرد زەمانەی پورجەور
مەجلس ملی هەردەم هانە شەور
بزانی هەڵوا نەتیجەی قوڕەس
لەمن نەپرسن تەکلیفمان چەس



(٣)

ئومیدوارم ئیران یەی سان‌بو
نەحاجی نەبەگ نەئاغا و خان بو
نەیەکی لەبان فەرش کاشان بو
نەیەکی لەناو کوچە وەیلان بو
هەرکەس کار بکەی کار ئەڕای فرەس
لەمن نەپرسن تەکلیفمان چەس

(٤)

ئەر لەیاد نەیرن دەورەی شەهریوەر
نانِ لوبیا بارینە نەزەر
خورما مەخواردن لەجیای شەکەر
چوار نەفەر شاد بین باقیتان پەکەر
جەمعێ مەواتن ساحەب بی‌بی‌هەس
لەمن نەپرسن تەکلیفمان چەس



(٥)

یەقین گومان کەن دوکتور باروسە
یاوە گەرد ملەت، ئمریکا دوسە
بیهودە ژەنن ئی تەپڵ̌و کوسە
خودا گەواهە دفای ناموسە
هەرگز گوڵ̌گە چی نیودەئەتڵەس
لەمن نەپرسن تەکلیفمان چەس

(٦)

یەی تەن پیرەمەرد پاکوسە لیمم
نەموحتاج ماڵ̌ نەزەڕو سیمم
پاکزادو حەق گو بی‌تەرس‌و بیمم
ئوستادم وەی تەور کەردەن تەعلیمم
حەق کوشی نیەکەم تائاخر نەفەس
لەمن نەپرسن تەکلیفمان چەس



(٧)

نەفت ملی کردم، موڵکیش ملی بو
تاکەی ئی‌کارە ژیرە جولی بو؟
روزگار وەکام تەوەکلی بو
حەسەن لات موحتاج حاجی‌قولی بو
ئەربوشی مردم بوشن وەتەوەس
لەمن نەپرسن تەکلیفمان چەس

(٨)

موسەدق کەی وەت توشیرەکیش بو
سەرتاپا عوریان لوختو ئاونیش بو
لەناو خەرابات نیرە دەرویش بو
سەرگەرم بادەو بەنگ و حەشیش بو
نیمی لە ئیوە چکیدەی شیرەس
لەمن نەپرسن تەکلیفمان چەس



(٩)

ملەت! وە قورعان وە سوُرەی یاسین
ئیوە سولّتانن لەلای خەلق چین
روزی چەن هزار لەمەیدان کین
چو بەرگ درەخت رزدەی زەمین
توپ چو ئمشی پاش خەلق وینەی مەگەس
لەمن نەپرسن تەکلیفمان چەس

(١٠)

هزارسالّ مە نو پای غارەتگەر
کوتاه بو لە مەرز ئیرانِ موزتەر
یەسە وەیاری بینای بان سەر
لەئیران نەیشتم یەی تەن لەکافەر
ئی نامِ نیکە پەی ئیرانی بەس
لەمن نەپرسن تەکلیفمان چەس






(١١)

ئیران نەئیران، موسەدق ئاباد

ملەت نەملەت، غولام ئازاد

لاهە نە لاهە، دیوان عەدڵ و داد

رەنج چرچیل کرد وەرەنج فەرهاد

ئیتر کوتا کە «شامی» سوخەن بەس

لەمن نەپرسن تەکلیفمان چەس

تاوسان ١٣٣١

# باغبان باکەس وەفانەکەرد

بنام بی‌چوون جەهاندارِ فەرد
موخبر جە هەر کار تەبیب جە هەر دەرد

زاتەش بی‌زەوالْ لوتفەش بی‌پایان
خودایش وەخەلق عالم نمایان

لوتفەش ئەر یاربود وەگەرد هەرکەس
غەرق‌بوو وەدەریا بەرنیە چوود وەدەس

مەردم گووش بگرین لەی بەدبەختی‌یە
دونەفەر یەی‌رەنگ لەئیران نیە

وەقەولْ «سعدی» پیر خردمەند
«مادەر نەزادەست یەی‌رەنگ دو فەرزەند»

«حافظ» مەنویسود: «رەفیق کیمیاس»
نەمەیود وەدەست تا دنیا بونیاس

عارف وەی دەردە مەبود وە دەرویش
راهِ بیاوان مەگیرود وەپیش

هەرچەن مەگەردم مەکەم جوستوجو
دونەفەر یەی‌ڕەنگ پەیدا نەمەبو

چکاری دیرم وەکار عاڵەم
بچم وەسەروەقت داستان خوەم

حەقا حەق برا! برای خاسی نید
ڕەفیق یەی‌ڕەنگ حق‌شناسی نید

تیواتی یەی‌شەو مەیوم وەماڵت
قەوڵت دروبی حاشا لەحاڵت

زمسان دامەسەر من وە انتظار
گوش وەحەلقەی دەر وینەی بدهکار

شەوی دوساعەت لەپشت دەر بیم
مُنتظر وەپای دوبەرادەر بیم

هەرشەو سەماوەر پیر جگەرسوز
چو عەزیز مەردە دادمەکەرد تاروز

سینی بەوینەی تەپەی گورستان
لەگوُشەش نوساو ئارامگای اسکان

نعلبەکی چون گوُر قاشق وینەی لەش
هەرلەشی لەناو گوُڕی درازکەش

استکان وساوی دەهەن بازکەردە
مەرواتی ئیمشەو عەزیزش مەردە

قەندان بەوینەی خورمای خەیرات بی
هەر فەریاد مەکەرد شەوِ بەراتبی

تەشتەك بەوینەی مردەشوُرخانە
هەر انتظار داشت چەو لە دەرانە

مەنقەل بەوینەی تەپەی کوەِتوُر
جای رازونیاز موسا با غەفور

قوری نائومید یەی گوشەی مەنقەل
وە نائومیدی گردووە بەغەل

چونموسا لەتوُر مەکەرد موناجات
وەدەرگای یکتای قازیُالحاٰجاٰت

مەوات: یایکتای جەلالِ جەلیل
نجات دەهندەی مُرصلِ خەلیل

وەشوعلەی ئاتەش بدەر نجاتم
دیتر نەمەندەن ئاه وە بساتم

وەتابِ ئاتەش منمەیوم وەجوش
چای جوُشیدە کەس نمەکەی نوش

یایکتای بیچون! حیلامەکان!
شەرمەندەم مەکەر وەروُی مهمان

تەنم چون زندان روکەردەن وەبەند
یارەب ئیجەورە بکیشم تاچەند؟

تەن موبتلای رۆح، رۆح موبتلای غەم
یارەب تەن‌و رۆح جوداکەر وەهەم

لەعنەت وەوکەسە من‌کردە قوری
ئەڕای پای مەنقەڵ بعضی وافوری

مەگەر سەبر من سەبر ئەیوبەن؟
زندگی وەی‌تەور ئەڕای چەم خوبەن؟

دوەشەو سیٚ‌ساعەت بعداز نسمەشەو
موقەی کە مەردم چونە جامەی خەو

یەی دەستی ئامان نەمی وە دەستەم
دەستەی شکستەی وە مەفتول بەستەم

لەخاو بیداربیم وەزورِ تەکان
چنگ نادە گەڵۆم سدام نایدە بان

دادکردم هەم چەس؟ جەمینەخانم!
وەی نیمە شەوە چەتوای وەگیانم

وەت: نوسرت‌ملوك هم سینەی ژان کەی
وەبەندە ادعای گوڵ گاوەزوان کەی

بەسك سەردی خوەی سەرد وەبانِ سەرد
چو مار پیچ‌مەخوەی وەزورِ دڵ‌دەرد

وەختی مەنیشود وەسەدر سوفرە
تەعاروف کردن وە دینی کوفرە

چوارقەند داغ پەنجچای هەفت هەشت پیاڵەشیر
سیٚ نان ِلەواش یەی دوازدە پەنیر

یە گشتی ناشتای عشرەت ملوکە
سەیل شکڵی کەی، چوٚ شکلٚ خوکە

شوی عشرەت ملوك حاجی غضنفر
ئەر بوشم خەرە، سەد رەحمەت وە خەر

چای دیر دەم‌کردود ئەڵساد وەقین
منو چوار اسکان کوتادە زەمین

من دەستەم خویردبی، استکان شکیاد
قاشوق چای‌خوەری هەفت‌هەشت دوشمین داد

سینی وەت: قاشوق! یە نانەجیمە
مەرحوٚم گەورای شابابای دیمە

یە کورٚ مەرحوٚم حاجی هاتەمە
سەدپارچە موڵك داشت هەم وەتیاد کەمە

وەناو موٚڵكِ خوەی بیە خالكِ شوخم
تەرەکتور پاشی وەبان سینەی توخم

چهل‌سالٚ تەمامە هامە ئی ماڵە
روٚحم دی خەستەس وەی قرمو قاڵە

بان‌گلان خاسە سالی سیٚ ساعەت
کاریك ئەنجام دەید چوود خەفید راحەت

دیتر کەس نەیری کاری وەکارەش
وەخابِ شیرین نیەکەن بیدارەش

ئیقاڵە رەسی وەگوُش بانگلان
وەتابو تعجیل هاتە لیو بان

دادکرد: ئەی فوری! بیعەقلو شعور
ئەبلەی بیکەماڵ لە معرفەت دوُر

تاتو واردبید وە مەرز ئیران
بیشەی شیران بی، توکەردیش ویران

مەردم تومو‌عتاد کردی وەچائی
دایدە دەس مەردم عاسای گدائی

گورگ وەختی پیربوو، خەم مەدەی کەمەر
بووە مەسخەرەی سەگِ سوقان خوەر

نُهصد سالِ پیش من لەتەی کوبیم
گوزەرگای پەڵنگ پەنای ئاهو بیم

پارچەم سەبزەزار سەرچشمەو روُدبی
تەفریگای مخصوص سوڵتان محمود بی

شاهانِ شوجاع، مەردانِ کاری
صاحب سابقەی تیرو سەواری

ئەگەر شەرح بیەم یەکی لە هزار
وەخت مەچوُد وەسەر پڕمەبوُد نەوار

یەسە پیر بیمە، پیرِ ئاخر شەڕ
نسمم بیە چاڵگ نسمم بیە دەسەڕ

یە چوارسەد ساڵە من بان‌گلانم
هەم‌نشینِ سەگ لەی‌بان لەو بانم

فەرزەند فغور فەرهاد نامەرد
وەتیشەی فولاد ریشەم بەرئاوەرد

فەرهادِ فغور، بی‌یە خونی‌من
من‌کرد وەفدای قەدو باڵای ژن

فەرهاد خونی‌من شیرین خونی ئەو
وەی تەور بازی‌کرد نەقشەی شاخسرو

من سەنگ‌ریزەی تیشەی فەرهادم
ئەو روزگارە خاس هالە یادم

بیمە سەد پارە هەرپارەی وەجایی
هیچ موسلمانی چوومن وەپی نای

بەعدەز گوفتگوی قوری‌و بان‌گلان
بچم وە سەروەقت باقی داستان

بچم وە سەروقت داستانەکەم
وەسەر بەدعهدی دومهمانەکەم

ئەوڵ ئەرز کردم من دەرویش‌وارم
تەعارف وەدوس کُفرە لەکارم

دوم یەی نەفەر فرمانبردارم
خجاڵت کیشم اسم پولْ بارم

دوشەو بان‌یەك شەوی پەنجتومەن
دامە شەوچەرە دەپانزدە شەومەن

لەناو پاکەت‌بی لە تاقچەی ئوتاق
بشنو لەجەفای موش قورمساق

یەی نیرەموشیك بیە مهمانم
نە وەعدەی گردوم نە ناوی زانم

شەوچەرم کردو وە سەحەرچەرە
گشتی کەل‌کردو ئەڕای مەسخەرە

یەی دەسماڵ ئاجیل دان‌دان شماردو
پوستەکەی هوشتو مەغزەکەی خواردو

هەرکەس وەدیدەش نیەونید نیەزانی
یەی خاکەناز توز نشتو وەبانی

نانِ فەرنگی چو سەنگ‌پای حەمام
تا دەسم بگری گشتی فرەدام

دوان پەرت‌کردم لەناوِ ئەی‌وان
سدای هەمسایە وەلیم هاتەبان

خاس‌بی نەشکانم وەنەدی مەردم
سیْ روژیش ئەڕای تاوان بگەردم

دوان پەرت‌کردم لەناو ئەی‌وان
سدای هەمسایە وەلیم هاتەبان

خاس‌بی نەشکانم وەنەدی مەردم
سێ رۆژیش ئەڕای تاوان بگەردم

ئەنار ساوە سەداش هاتەبان
وەت هەڕاجم‌کەین جور چاڵەسەن‌خان

بیمەسە عەروس بی‌حوسن‌و جیاز
سیر بیدەم ئەڕای کوڵفەتی پیاز

یاڕەب بەدبەختی رونەکەی وەکەس
هەرکەس بەدبەخت‌بو، مەرگی بیەو بەس

ئەوسا کەمن بیم وەشاخەی درەخت
فەرمان‌رەوا بیم چوو سوڵتان وە تەخت

من وە لابەلای بەرگِ خوەش منظر
چوو کودك لەبان دامانِ مادەر

شەب‌نەم شەب مەداد ئاب وە روخسارم
نسیم پاك مەکەرد گەردو غوبارم

سەحەر وە نەغمەی مُرغ خوش ئاواز
سەبا مەجونباد گەهوارەم وەناز

لالەی سوپاخیر سەحراو کوه و دەر
وەفەرش دیبا پوشاو سەراسەر

گوڵان سەف کیشاون لە اطرافِ جو
هەرگوڵی ڕەنگی هەرڕەنگی یەکـبو

خار وینەی سەرباز سوپای پیادە
سەرتاسەر گرتو اطراف جادە

بوعطر گوڵ سورخ غونچەی نەشکوفتە
نەغمەی ڕەوان بەخش مُرغ ئاشفتە

چون سوپای بیژن خار دامان‌گیر
پەی ڕەزم خەزان تیزمەکەردەن تیر

شبنم مەزانست ڕەسم روزگار
پەی بەدبەختی من مەگریاد وە زار

مەوات: ئەی ئەنار! ئەی نازپەروەردە!
باغبان باکەس وەفا نەکەردە

بسیار وینەی تو لەی باغە بیەن
امروز ئاساری لەلیشان نیەن

هەفتادوهەفت ڕەنگ میوە پەی دەرپەی
ڕەدبو لەی باغە لەبادام تا بەی

جودا بید وەگوڵ دورکەفید وەباغ
قەلبت پرخون‌بوو وە دەردِ فەراغ

مەکەفید وەدەس جەوانِ ئەحمەق
هەم نشینت کەی وەشیشەی عەرەق

نارنج! وه ئەروای گوڵابی قەسەم
هەرچی شبنم وەت یەكیەك دیم وەچەم

بشنو لە نارنج خوەش عەترو خوەش بو
وەت: ئەی داش ئەنار! وه ئەروای لیمو

منیش وینەیتو وەشاخەی دار بیم
چو سوڵتان وەتەخت ویم بەرقەرار بیم

گوشم هەمیشه وەنەغمەی سازبی
سەرم ئاشفتەی کرشمەو نازبی

سەبا وەزیربی شبنم نازر بی
بوڵبول لە بەزمم دایم حازربی

نەسیم دادەپیم وه یادگاری
عەتری نمونەی مشك تاتاری

من وەیادگار نەسیمِ دوسم
هەنوز بویعەتر مەیو جه پوسم

یەی روز بەدبەختی هاتە دیارم
باغبانِ پیر کەفتە هاوارم

دەردەم فەرمانداد صندوق ئاوردن
منیش وینەیتو بیچارە کردن

منیش وینەی تو کەفتمە ئەمار
حاشا لەوەفاو رەسمِ روزگار

یە لە بەهاربی، بشنو لە پائیز
بشنو لە دونیای دونِ غەم‌ئەنگیز

چەمەن بعداز گوڵ بەسکیٚ زاری کەرد
سەبزی روخسارەش عوض‌بی وە زەرد

حملەبرد وەباغ بادِ غارەت‌گەر
رەنگ نەمەن لەروُی سەرو سنەوبەر

حملەبرد وەباغ بادِ غارەت‌گەر
رەنگ نەمەن لەروُی سەرو سنەوبەر

بەرگی سەبز نەمەن پەی ریختەی قەسەم
وەشاخ گوڵ‌سورخ بوڵبول مەکەرد رەم

عاشق‌و معشوق یەکـیەك چین وەدەس
بوڵبول کەفتە تون گوڵ کەفتە تەوەس

مأوای بوڵبوڵان بی وەلانەی زاغ
نەباغبان مەن نەیاران وەباغ

وەحملەی خەزان پەردەی گوڵ دڕیاد
پای بوڵبول لەسەر شاخ گوڵ بڕیاد

ئاساری لەگوڵ غەیرەز خار نەمەن
صدای مُرغ ژان لەگوڵ‌زار نەمەن

صدای زیل‌و بەم ریختەی خشکە بەرگ
نەمەك مەپاشاد وە مەجروحی جەرگ

بادِ بەرهەم زەن خانەوادەی گوڵ
خون مەکەرد وەجەرگ عارفو عاقڵ

نە سەبز وە سەحرا، نە بەرگ وە داران
نە گوڵ، نە گوڵچین، نە گوڵعوزاران

نە جام، نە ساقی، نە مینا، نە مەی
نە موترب، نە ساز، نە بەربەت، نە نەی

درەخت چو ئەڵوات پاك باختەی بیعار
سەرتاپا بەرگش باختو وە قومار

سدای رودخانە چون ئاوازِ پیر
ئاه بیئەسەر نالەی بیتەءسیر

سەحرا بی وەجای دەڕندەو خونخوار
گاو بازنشەسبی گورگ هاتە روکار

دریادە قەساو، گاوِ رەنجبیوەر
خوەردمەن پەی یابو، بارکیشان پەیخەر

سەحرا بیلەزەت باغ بی سەرپەرەس
رودخانە وینەی مەریزِ بیکەس

خەرگوش باغبان روبا ساوباغ
شەغال شەوتاسوب دادمەکەرد وەداغ

سدای زیلوبەم بانگ نوشانوش
لەتەرفِ بُستان کوتابی وەگوش

بەدەڵ مەجنونان لیلی گوم کەردە
کەشکی فەرهادان پەی شیرین مەردە

جەڵەب وامقان گومکەردەی عوزرا
هەرکام دەمعشوق ویشان بین جودا

نەسیم تەنهامەن لە کوهساران
گوڵو گوڵمەگەشت جای بەزمِ یاران

سەرگەشتە وینەی مەجنون مەکەرد گەشت
دیار وەدیار سەحراو کوەو دەشت

ثابتبی وەپیش دورەنگەن دنیا
جوز موشتی اشغال نەمەندەن وەجا

پوس چنجەی کەدو فنوقو پستە
چوپنبەو پاکەت بوتری شکستە

لەجای بەزم خوەش میرزا سەماوەر
ئاساری نەمەن غیرەز خاکستر

کەفتەبی وەپای شەمع ئەفروختە
لاشەی پەروانەی زار پەرسوختە

نەسیم مەجبوربی رو نیادە شار
کوەوکوە مەگەشت حەسار وە حەسار

ئەوڵ هاتە ماڵ تەبەقەی ئەوەڵ
زالو صفاتان بەو پیشەو عەمەڵ

هەفتپشت عەمارەت لەئاخەرین پووش
سروت مەلائك مەشنەفتەن وەگووش

پەردەی ئەبریشەم پوشت دەری مەخمەڵ
بخارو وینەی توپو مسلسل

موتەکای پەرقو وەت وەتەختخاو
نەسیم غەڵەتکەی پابنیدە ناو

وەقەلبی مەجروح ماڵاماڵ وە دەرد
نەسیم وە ئەفسوس کیشاد ئاهِ سەرد

دوم هاتە ماڵ تەبەقەی دوم
ئەوەیش ئەوتەوربی نە ئەوتەور مُهم

لە دو خارجبی کەمکەم هاتە سێ
ئەلغەرەز هیچکام ری نیانە پێ

لە هەرتەبەقەی چەن بەدو بیجا
ئەوان وەنەسیم نەسیم وە دنیا

سوم هاتە ماڵ تەبەقەی ئیمە
وەت وەمەزهەبم هەر ئیرە جیمە

کەمکەم واردبی وەبەندە مەنزڵ
یەك ئوتاقی دی ساختِ چینەو گڵ

ئوتاق دو دەر شەش، مەخروبەو نمناك
تاریك بەوینەی زندانِ «ضحاك»

نەسیم نگاکەرد وە وضعِ بەندە
گردەمە دەسگاو مەسخەرەو خەندە

یەی‌جوفت دەسگیرەی وەکار نەکفتی
یەی دانە کەف‌گیر ساڵەها خەفتی

یەی دەستەی گوش‌کو، خەستەی گوشتِ‌گاو
چوار جامِ روحین یەی سطڵ جائاو

لافەکەی «شامی» فصلِ تاوسان
وەناو سەوەتە بایەس بوەیدەی بان

**تاوسان ١٣٣٧**

# شعر نەو

یا فەراق ئاخر کوشیدم یا غەمِ ئەشعار نەو
وەی دودەردە ئەر نەمردم، دی نەلەرز دیرم نە تەو

ئاب‌و خاك قاڵب نەکەردە، گڵ وەپی‌ئوشن نەخشت
زەحمتِ سەرمای زمسان رتبەی یەخ دەیدە ئەو

قصّەی بی‌مەغزو مەغز ئازارو پوچو بی‌لەزەت
دیم وەهەر جەمعی خوەنینەی ئەهلِ مەمجلس کەیدە خەو

رەوغەن‌و گوشت‌و برنج‌و لیوموعەمانی‌و سیب
کەی وەخامی بود بخوەیدەی تانەکریەیدە چڵەو

شاعرِ شیرین کەلامِ شیعر نو! هەر یە بزان
عافیت دورەن جەسەرکار ئەر بخوید هەشت مەشکە ئەو

کاغذی نفڵە، قەڵەمِ رەنجەو خوەت خەستە نەکە
راەتو وە ترکسان چو ئەی عەرەب! بی‌خود نەدەو

قافیە سوڵتان شیعرو قاڵبِ خشتِ سخن
خشت بی‌قاڵب چحاصل موڵكِ بی‌سوڵتان خرەو

روحِ «سعدی» شاد که نویسی کەس لە ئی مهنەتسەرا
«تانەکیشد رنجو مهنەت، گەنج وەنەسیبی نیەو»

سەدهزار ئەفسوس کەبردم سەدهزار حەسرەت وەگور
باعثِ بەدبەختی من چەرخ دونِو چەترِ کەو

شیعرنو بایەد وەژستو ناز مەخسوسی خوەنی
ئەر وەمەردانە خوەنیدەی حەرفِ موفتەو ناحەسەو

شیعر نو کوهنە وەیادم برد، نیەزانم چارە چەس
قصّەیی بیمەغز بعضی مەغز «شامی» کرد خرەو

**زمسان ١٣٤٠**

# ڕۆن نەواتی

مەردم باینە دیار ئی بەدبەختی‌یە
ڕۆن خاترجەم وەی شارە نیە

پەتو فرەتم، مەوج نیامە گرەو
ئەڕای خەرجو بەرج عەید ساڵ نەو

چوم ڕۆن بسینم لەیارو بەقاڵ
ئەڕای ناوهەڵوای جومعەی ئاخرساڵ

سڵامی کردم، وەت: ئەڵەیك گشت‌کەس
ئەوکاسە ئەڕای چەگردید وەدەس؟

ماس‌توای نەیرم، ڕوب‌توای نیە
شیرە دوجور هەس، سفیدو سیە

وەتم: ئەی‌مەشەی «زندەی گیانت‌بو»
بەقاڵی بایەس گش‌جنسی داشتو

شیرینی شەکەر تا شوری نمەك
توخمِ کاسەپشت تا حاجی لە کلەك

عوناب‌و خاکشیر، جەوهەر میوە
هەر لەگڵ سەرشور تا گڵ گیوە

ئاهِ سەرد کیشا بەقاڵ وەدڵگیر
وەت نادرویستی پیرم کەردەن پیر

زەرفِ ماس تیەرم دوهەفتە مینیت
ئاو نیشاستە کەسی نیەسینیت

ئەر پەنجای ئەڕای موشتەری کیشم
بەیدەی ماڵو تیەی نەمیتە ریشم

دوای مەرافەو داواو توسەری
کەم‌کەم کارکیشت وە کەڵانتەری

دیم بەقاڵ‌بوور دەسم دیدە شەڕ
کەیدەمە کەوتر قەیچی باڵوپەڕ

بی‌جورمو تەقسیر عوزرو بەهانە
شاپەڕم کیشن کەنەمە لانە

وەتم ڕون توام، ڕونِ خاترجەم
ئەر دیری بیەپیم گیانِ خوەت قەسەم

بەقاڵ گورجەوبی ئەوەڵ‌کاری کرد
دەسِ چەپ هاورد دەس ڕاسم گرد

ماشەڵا وەزور مەشەی ئەلیەسکەر
وەئەوەڵ تەکان کیشادەمە وەر

پەنجەم جور تەسبیهـ  پەنشەش دەور شمارد
سی «توبمری» و چوارده قەسەم خوارد

وەت: خوەم عەشایر چەکیدەی کوردم
دەمەن ڕۆن لەماڵ خاڵوم هاوردم

کەرەی بێ داخڵ، ڕۆن خاترجەم
دەساو «خوەرشی» خاڵوژن خوەم

دوێکە تائیمرو شەش‌مەنی بردن
هیچ‌کام وەقەدتو ئیراد نەگردن

دوساعەت‌ونیو لەڕۆن تاریف کرد
وەگیان سەرکار مەغز لەسەرم برد

وەتم: پەنجای چەند؟ وەت: شەش تومەن‌نیم
وەتم: گیان خوەت یەی‌پەنجا بیەپیم

نە مەزەی کردم، نە لەلی خواردم
شەش‌تمەن‌ونیم ئەڕای شماردم

هەرچەند قەرزکردوم وەلی وەخوشحاڵ
شیرەو ئاردو ڕۆن هاوردمە ماڵ

تاڕۆن ڕشاندم وەناو تاوە
دیم بوٚگەنِ ڕۆن خەیلێ خراوە

وەگیانِ سەرکار شوخی دەررەفتە
من گەمان‌کردم بووگەنِ نەفتە

لەناو تاوە، لەبان پریمز
یەیهەڵوای پەزین خوش‌رەنگ‌و قرمز

زەڕەی لە هەڵوا نیامە بان زوان
دڵو دەرونم وەختو بایتە بان

تاوە هەڵ گردم بەرەو ناو هەسار
گن‌گن لەی هەڵوا دامە قەی دیوار

هەمسایەیل وەتن: «شامی» شیت‌بیە
وەتم: نەمەردم یە بەدبەختی‌یە

پوڵم هەرامە یە بایەس بڕشیت
ئەر بەشی بکەم، مردیەکان کوشیت

یە ڕون کەلەو ڕون نەواتی‌یە
سیف ئیمریکایی! گەردی قاتی‌یە

دامەی قەی دیوار ماڵەیك هاوردم
تاقنمای ناوەڕاس بەن کەشی کردم

ئیقاڵە رەسی وەگووش ساهیوماڵ
هاتە ناو هەسار کردەی قرمو قاڵ

ژنِ صاحێوماڵ، وەماڵ هاتە دەیشت
وەتوٚ چ پهنان مردگ ئەڕام نەیشت

ئەو هەر دوشمین‌دات، من دەنگ نەکردم
ئاخر مەجبور بیم ناو باوکی بردم

تا یەی دوشمین دام، هەم پیاو هەم ژن
چو سەگ هەڵامات هاوردن پەی‌من

پیا هاتە وەر، ژنە کەفتە پشت
چنگ نانە حەڵقم وەزیلەو وە مشت

هەفت هەشت دەس خواردم، دودەس وەشانم
بیس کرانشین ڕشیانە بانم

ناو حەسار بی‌یە مەیدانِ نەبەرد
جەنگ شروع کریا وەئەسڵەحەی سەرد

وە تەشتِ ڕەخت‌شور، ئەفتاوەو ئاوپاش
یەکی ئاتەش‌ڕیز، یەکی وەمەقاش

طایفەی ئەوان، فامیلەیل من
ئامادەی جەنگ‌بین هەم پیاو هەم ژن

من دیم کارگەنە، ناو خودا بردم
کراواتەکەی باقرخان گردم

هەروەك کیسەکەش لەناو حەمام
دریژی کردم مشتو ماڵی دام

باقرخان لەژیر بیس‌نەفەر لەبان
من لەناوەڕاس، جور کەواو لای نان

شەمەو شەکرالی، شمس‌اللەو شیراز
موسیٰو ماموەلی مصطفیو میرزا

سەفەر وەسیلەو موشتەبا وە مشت
داراخان دادکرد کەریم کازم کوشت

بچیم وە سەروەخت ژنەیل دەلیر
دەستەی چو پلنگ عدەئی وینەی شیر

مەرزیەو مەهوەش مەهینو مەهناز
شهرەو شەرارە شەهینو شهناز

آمنەو ملوك آسیەو اقدس
زوڵف یەكتری پیچانون وەدەس

تابان وەتاكەوش جیران وەجاڕو
لیلا وە لەقەو گوڵبانوو وەچو

کیشوەر وەکوچك دادە عەلیخان
یەیرەدیف دنان ئاریەی شکان

خەنە لیردابی حەسەن سیول قەو
وەسیلەی عەباس نەقش بەساوە زەو

دو زەڕع وەیەی زەڕع زەمین فەرش کردو
چمان لەشی بی سیڕوژ پیش مردو

زەمین فەرش کردو چوو قالی کوڵپای
گاهی غەش مەکەرد گاگا مەوات ئای

مەهوەش مەدهوش بی، قەمەرتاج غەش‌کرد
نصرت خوەی هەڵاك لەبان لەش‌کرد

چەن شیشەی ماتیك لە هنگام جەنگ
ڕشیاوو شکیاو زەمین کردو ڕەنگ

خاك ئەو زەووە وەعەقلْ بەندە
خاك خانمەیل ئارەزوو مەندە

یەی کیلو کەنیاو زولْف‌کیس جوراجور
هەنایی، سفید، سیاه و بازو بوور

سەدتومەن بیشتر شکیاو وەژیر پا
شانەو گیرِ زولْف ساختِ ئامریکا

دوساعەت‌ونیم جەنگ ادامە داشت
سەد لەعنەت وەڕون توخم نزا کاشت

بعداز مەرافەو دەعواو قرمو قالْ
سەیل جەنگ‌کەرەیل یەك‌یەك چینە مالْ

خوەم تەنیا مەنم وە دلْەی پوڕدەرد
گیجو سەرگەردان شەرمەندەو رو زەرد

نەڕای پەستم بی نە ڕاگەی پیشم
نە روی مالْ خوەم نە قەومو خیشم

وەتم صوب بچم سماری بارم
هەستیم هەراج‌کەم بچمە پەی کارم

«شامی» مەرافەی ڕون نەواتی
هەستیت دادە باد خستدە لاتی

زمسان ١٣٤٤



پەریشانم‌و پەریشانم، وڵم‌کە
دوچارِ دەردِ پنهانم، وڵم‌کە!

وەدەردم ئاشنا کردی نەکردی
ستەمگەر فکر دەرمانم، وڵم‌کە!

وڵم‌کە تانەوەیت کەس پەی وەدەردم
دوسێ روژی کە مهمانم، وڵم‌کە!

نەگرت‌کەس دەعوەتم خوەم بیمە مهمان
وەکارِ خوەم پەشیمانم، وڵم‌کە!

حەمامە ئی‌سەرایِ سەردو گەرمە
بساو کیسەیی وەناوشانم، وڵم‌کە!

نەساختِ من وەفوولادە نە وەسەنگ
هەف هەشت دەتیکە سوقانم، وڵم‌کە!

تەنم زانم نەسیبِ مورو مارە
نەمورم نە «سلَیمانم»، وڵم‌کە!

وه‌کامِ که‌س نیه گه‌ردد چه‌رخ تاسه‌ر
نه‌ده‌روێشم نه‌سوڵتانم، وڵم‌که‌!

وه‌واویلای دڵ هه‌رشه‌و ره‌وانه
سرشکِ غه‌م وه‌دامانم، وڵم‌که‌!

خه‌رابم‌کرد خه‌راباتِ خه‌یاڵت
وه‌ده‌ست چوود عه‌قڵو ئیمانم، وڵم‌که‌!

وه‌باده‌ی ته‌لخِ جامِ زنده‌گانی
ده‌می مه‌ستو غه‌زه‌ڵخانم، وڵم‌که‌!

وه‌سه‌حرایِ خیال چون قه‌یس‌سانی
توکردی ویڵ‌ووه‌یلانم، وڵم‌که‌!

گوزه‌شت فه‌سلِ به‌هارو موسمِ باغ
وه‌فکرِ له‌رزِ زمسانم، وڵم‌که‌!

له‌وه‌ترسم بکیشند کار وه‌هاوار
نه‌که‌ی که‌س گوش وه‌ئه‌فغانم، وڵم‌که‌!

وڵم‌که‌ید یا نیه‌که‌ید ره‌حمی وه‌حاڵم
ته‌نم‌کردی وه‌زندانم، وڵم‌که‌!

وه ئه‌رواحِ شه‌رف سه‌وگه‌ند که دائم
مه‌لوولِ مه‌رگِ وجدانم، وڵم‌که‌!

شه‌ره‌ف کوشیادۆ وجدان جوانه‌مه‌رگ‌بی
وه بی‌وجدانی حه‌یرانم، وڵم‌که‌!

وەکام دوشمەن بووەم ئەی‌دووس شکایەت؟
کە دووس‌بی قاتلّ گیانم، وڵم‌کە!

وڵم‌کە! وڵ کەرت‌نیم سوب لە مەحشەر
توکردی خارِ دەورانم، وڵم‌کە!

توکردی بی‌سەرو سامانیّ «شامی»
وە مەولا خوەم قەشەنگ زانم، وڵم‌کە!

بهار ۱۳٤۹



من اگر اهل وفا یا بی‌وفا بودم گذشت
مدتی مهمانِ این محنت‌سرا بودم گذشت
زاغ بودم در چمن، یا بلبل افسرده‌حال
در گلستان جهان گل یا گیا بودم گذشت

**پاییز ۱۳۵۱**



خیش‌و بیگانه بزانن قاتلِ گیانم تونی
باعسِ ئاه و فەغانِ شامِ هجرانم تونی
بی‌سەبەب بارانِ دیده دامەنِ کەس تەڕنەکرد
مایەیی ئەشکِ عەیان‌و ئاهِ پنهانم تونی
خوەم شناسم دوزوخاو دیدەو ئارام دلّ
توهمەتِ ناحەق وەکی‌کەم؟ بی‌وەفا زانم تونی

پاییز ۱۳٥٤

# خاوغەفلەت

دنانم ژان‌کرد پەی دەوای دنان
سەرخوەم هەڵ گردم وەرو خیاوان

دوست وەوەخت تەنگ مەکەی یادِ دوس
لە «ابرایم ئاباد» چیم وەرەو «سیروس»

لە «سیڕای سیروس» دنان سازیگ هەس
ئەو دنان سازە رەفیق بەندەس

وەتم چمە لای ئاغای موسەنن
بیەم دەرباری دنانم لەبن

هەمریش هەمقەیچی دەمە دەسِ خوەی
توای بکیشی یا پڕی بکەی

چون رەسیم وەسەر «سیڕای ساراوەگ»
جەم بین یەی‌عدەی جوان بی‌رەگ

یازدە نەفەربین، هەریازدەی خومار
گشت وەخوماری تەك‌داونە دیوار

هەریازدەی خومار هەریازدەی پەکەر
گشت وەپەکەری سینە داونە خوەر

لەورە ایرج دیم کوڕ یارو عەتار
لە باڵاخانە گەرت خستونەی خوار

باڵاخانەی گەرت وەبەسکی بەرزە
بیەسە قاتل هەرچی سەر هەرزە

هەرچی سەرهەرزە یا پەهڵەوانە
ئاخر خەنەیخوار لەو باڵاخانە

رەفیقەیل وەزور قەسەمو قورئان
تا ئاخرپلەی هریون بەنەی بان

کەمکەم بەنەنەی تا ئاخرپلە
لەورە دی زانن پەڵەوان شولە

دەڵەك نەنەلی لە بام هەستی
خەنەی ناو گرداب فەقرو تەنگ دەستی

یەیوەقت بیداربود لەخاو غفلەت
غەرقەن وەدەریای نفرینو نفرەت

چو سەگی سفور دەوای دویە پی
چڵم وەلوتی چوود ئاو وەچەوی تی

لارەی سەری تی لەناو خیابان
لەبان دەیدە خوار، لەخوار دەیدە بان

فکری پەریشان حەواسی پەرتە
زکرِ زوانی یاگەرت یاگەرتە

یاگەرت یاگەرتی یاگەرت وەمن دەر
وەی بەدبەختی‌یە نجاتم بدەر

چیدە خیابان شەویل شەمە
خیزو دوز فرە، پەڵەوان کەمە

هریون وینەی موش گشت کردەلانە
قەن‌داغ خوەر نەمەن لە قەوەخانە

خیابان! مەولا بکەی خراوت
چەن‌جور جنایەت کریەد لەناوت

لەی‌لا باوگی‌دیم وەداغ کوڕی
چنگ خەیدە صورت یەخەی خوەی دڕی

هەم دەیدە سینەو هەم وەناو چەو
هەم ئوشی یاڕەب! کەس هەم‌دەردم نەو

یاڕەب! کەس چومن ڕەنجی بیوەرنەو
خوردەو خوراکی خوین جگەر نەو

پەنجاوپنج شەش سال لەعومرم چیە
لەهوچ ادارەگ سابقەم نیە

نە کوڵابەردار نە حوقەبازی
عومری دامەسەر وە سەرفەرازی

جوزبازو منت نەکیشام وەکەس
نان وەدروستی هاوردم وەدەس

یەی کوڕی دیرم نوزدەساڵی‌یە
مەوقەی زندەگی ژن‌و ماڵی‌یە

مەوقەیگە چودار وەسای بنیشم
ئاهِ راحەتیگ وەدڵ بکیشم

وەلی میوەی موزد باغەبانیم
تەلخ کەردەن بادەی زندەگانیم

هزار دەف وەتم ئەی‌روڵە! هاوار
لەناو هەمسایەل سەرم خەیدە خوار

دوخویشك دیری نەجیبو سەنگین
تو کارِ گەن کەی، ئەوان بون نەنگین

خویشكِ گەرتی کەسی نیەخوازی
کی‌لانە لەدەر لانەی‌مار سازی؟

هزاردەف وەتم تولە مارِ زەرد
وەگەردِ رەفیق نادروس نەگەرد

ئەر هەفتەی وەگەرد گەرتی بگەردی
تاروژِ مردن موبتلای دەردی

دەرد بی‌دەوای عەلاج ناپەزیر
قاتل‌تەر جە سل، کاری‌تەر وە تیر

ئەگر «ئەفلاتون» شەو بایدە ماڵت
«ارسطو» بکەی فکری وەحاڵت

«لقمان»و «سقرات» هەرچوار بنیشن
هەر چوار رەی بیەن نەقشە بکیشن

«ئەفلاتون» وەدەرد بیدەوات، ماتە
«لُقمان» منتظر رەی «سُقراتە»

هەرچەن بنیشن هەرچی بکەن شەور
نتیجەت نوسن ئاخر ئەڕای قەور

روڵە! چەت بوشم؟ چەت بارم وەیاد؟
رەنجت بیوەر بوو، رەنجم دایدەباد

بایەو تەشتِ مس، قاولەمەو قازان
گشتی فرەتی دەنگم ناتە بان

قەیچیو گازئەنبور، دەس تیشەو قەنشکن
یەیتیکە ئەسپاو نەیشتید ئەڕای من

قەیچی لەتاقچە ناخن وەپی گرد
تاقافڵ کردم قەیچیە گەچ برد

ئەفسوس پەی رەنجی منکیشام یەیعومر
ناوت حوسین نام، ئەڕا بید ەشمر؟!

هەرسات چو گاپیر چنگ نەیدە حەڵقم
توای وەچەقو دەراری حەڵقم

نیەزام کووبچم، روو وەکی بارم
هەمسایەیچ نیەکەی گوش وەهاوارم

گووش هەمسایەیچ وەقاڵم پڕە
مەولا نابودکەی ئی باوکو کوڕە

چون پەند «شامی» نەشنەفتی وەگوش
گەرتی بید کەمکەم بیدە گەرتفروش

یەسە کارِ تۆ کیشادە زندان
خوەم زانم لەورە گەنت تیەیدە بان

چەپاڵەو ئوردەنگ سیلەی چەپو راس
زوانت کولکەی تیەیدە التماس

سەرت سەرنگوون بەڵای ِ بەدبوو
دەردی کەگردی نصیب خوەد بوو

**زمسان ١٣٥٤**



دڵ وەزەنجیرِ فەرقت راهِ  ئازادیش بەنە
کارِدڵ هەردەم وە دووریت، دادو ئاه  و شیوەنە

داد وەبەدعەهدیِ خووبان هەرکەسی دیریت وەلی
گووش گەردوونِ ستەمگەر کەڕ وەفەریاد مەنە

دڵ وەفەریادو فغان کرد خیش‌و بیگانە مەلوول
بی‌وەفا! ئایا دڵ‌تۆ سەنگِ سەخت یا ئاهەنە

سەنگِ ئومیدِ وساڵت شیشەیی سەبرم شکاند
بەرقِ شەمشیرِ فراقت قاتڵ گیان‌و تەنە

خوەم عەجەب دیرم وەتاڵەی شوومِ کەجبنیادِ خوەم
میهرەبانی گەردِ هەرکەس کەم، وەگەردم دوشمەنە

بی‌سەبەب سەرگەشتە مەجنوون چی وەسەحرای جنوون
مەر نەزانست رەسمِ خووبان بی‌وەفایی کەردەنە؟

تادەم مردن دەمادەم، دەم وەدیدار تودەم
تابزانی دڵ ئەسیرِ چاوِ تورك، چون بیژەنە

گیان وەچەنگاڵ فەراقی دەرنیەکەی «شامی!» نەکە
داد وەبەدعهدیِ خووبان، مایەی خون خوەردەنە

بهار ۱۳۵۲

## خوێنەری هێژا!

لەم کتێبەدا ئەگەر وشەیەك کرماشـانیت چـاوپێ کەوت کە نەتبیسـتوەو نازانی ماناکەی چیە؛ لەیرەدا بۆی بگەڕە. مانا سورانیەکەی لەپێشیداو لەناو پەڕانتزیشدا مانا فارسیەکەی نوسراوە.

بەڵکو لە جوانتر تێگەیشتنی شێعرەکاندا، یاریدەتبدا.

**ئاریە:** دەسکرد. (مصنوعی)
**ئامان:** هات. (آمد)
**ئوشن:** ئەیژن، دەڵێن. (می‌گویند)
**ئەڕا:** بۆچی، لەبەرچی. (چرا)
**ئەڕای:** لەبەرخاتر. بۆخاتر. (برای)
**ئەڵوات:** لات. (لات، بی‌سر و پا)
**ئی:** ئەم. (این)

**بارم:** بێرم، بهێنم. (بیاورم)
**بایت:** بێت. (بیاید)
**بایەس:** ئەشێت، دەبێ. (باید)
**بتنە:** بوگنەسە، بونەتە. (شده‌اند)
**بچود:** بڕوێت، بچێت. (برود)
**بخوەیدەی:** بخوێت، بخوەیت. (بخوری)
**بڕیاد:** بڕیا، بڕا، قرتیا. (پاره شُد، برید)
**بکەر:** بکە. (بکن)
**بوشم:** بێژم، بڵێم. (بگویم)
**بەرچود:** ئەچێت، دەچێت. (می‌رود، می‌گذرد)
**بەدەڵ:** زڕە. (بَدَل)
**بەیدەی:** ئەیواتەو، دەیباتەو. (می‌بَرَدش)
**بێداخل:** بێ دەغەڵ، خالیس. (بی‌دَغَل، مُطمئن)
**بیەسە:** بوەتە، بوگەسە. (شده است)

**پوش:** تەبەقە، نهوْم. (طبقه)
**پەخشە:** توْفانە، مێشولە. (پَشه)
**پیچان:** پێچان. (پیچیدن)

**تواسن:** گەرەكبُون. (خواستن)
**توای:** گەرەکتە، دەتەوێ. (می‌خواهی)
**تەڵکە:** تەشقەڵە. (باج سبیل)
**تەو:** یاو. (تب)
**تیەت:** تێت، دێت. (می‌آید)
**تیەد:** تیەت، دێت. (می‌آید)
**تیەڕم:** تێرم، ئەیهێنم. (می‌آورم)
**تیەی:** تێت، دێت. (می‌آید)

**جور:** وەك، وەکو. (مانند)
**جە:** لە. (از)

**چڕە:** بەقینەوە بانگ لێ‌کردن. (خشمگین بانگ دادن)
**چمان:** وەك بێژی، وەك توْبڵێی. (تو گویی)
**چنجە:** ناوك ئاجیل، ناوەی توْم. (مغزپسته و تخمه)
**چو:** وەك، وەکو. (مانند)
**چوت:** ئەچێت، دەڕوێت. (می‌رود)
**چەو:** چاو، چەم. (چشم)
**چی:** چو، ڕوّی. (رفت)

**حەسار:** حەوش. (حیاط)

**خاترجەم:** بێ‌دەغەڵ، دڵنیا. (مطمئن، خالص)
**خاو:** خەو. (خواب)
**خستدە:** خستتی. (انداختت)
**خوەد:** خوەت، خوّت. (خودت)
**خوەنی:** بخوێنی. (بخوانی)
**خوەنینەی:** ئەی خوێنن، دەیخوێنن. (می‌خوانند)

**خویرد:** ورد، شکیاگ، شکاو. (خُرد، شکسته)
**خەڕگ:** هەڕگ، گلڕ، قوڕ. (گِل)
**خەس:** هەس، خەست. (غلیظ)
**خەنە:** ۱. گیایە کە لەسەری دەگرن؛ ۲. کەنین، پیڕکەنین. (۱. حَنا؛ ۲. خنده)
**خەیت:** دەیخا، ئەیخا. (می‌اندازد)

**دادە:** دای لە. (زد به)
**داش:** سەقف سەر تەنور نانواخانە. (سقف بالای تنور نانوایی)
**داشتو:** بیبێت، بیوێت. (داشته باشد)
**دڕیاد:** دڕیا، دڕا. (پاره شد)
**دنان:** ددان، دیانگ. (دندان)
**دوەشەو:** دوێشەو، شەوی پێشو. (دیشب)
**دوێت:** کچ، کەنیشك. (دختر)
**دەساو:** دەسکار، دەستاو، دەسوکار. (دستکار)
**دەڵەك:** دەس پێوەنان. (هُل دادن)
**دەیشت:** دەرەو، دەرەوە. (بیرون)
**دیتر:** ئیتر. (دیگر)
**دیرم:** هەسم، هەمە. (دارم)

**راگە:** رێگە، ریە. (راه)
**رشاندن:** رژاندن. (ریختن)
**رشیان:** رژیان، رژان. (ریختن «لازم»)
**رەسی:** گەیی، گەیشت. (رسید)
**ریخ:** ریخ، خیز. (ریگ)

**زەوو:** زەوین، عەرز. (زمین)

**ژان:** ئێش. (درد)

**سفور:** سپور، گەسلدەر. (رفتگر)
**سمن‌کاری:** جێگای بەسمنت (سیمان) دروست کراو. (بنای سیمانی)
**سوقان:** پێشە، ئێسك. (استخوان)

**سەدای بایدەبان:** دەنگی دەربێ، دەنگ بەرز کاتەوە. (صدایش در بیاید)
**سەرهەرز:** بێشەرم. (هرزه)
**سیله:** زیلله، شەپلاغه. (سیلی)
**سینی:** ١. سینی، کەشف؛ ٢. ئەسێنی، دەکڕی. (١. ظرف سینی؛ ٢. میخرد)
**سیوڵ:** سمێڵ. (سبیل)

**فرەتن:** فرۆشتن. (فروختن)
**فەراق:** دورکەوتنەوە لەیەك. (دوری)

**قافڵ:** بیئاگا، بێ خەبەر. (غافل)
**قرمو قاڵ:** هەراو جەنجاڵ. (همهمه و شلوغی)
**قورب:** ئابڕو، ئیحتوبار. (ارزش، اعتبار)
**قەو:** قوت، قنج. (برآمده)

**کوچك:** بەرد. (سنگ)
**کوشیاد:** کوژیا. (کشته شد)
**کوشیدم:** دەم کوژێ، ئەم کوژێ. (مرا میکشد)
**کەیدە:** دەیکا، ئەیکا. (میکند)
**کیشاد:** کێشای. (کشید)

**گردید:** گرتت. (گرفتی)
**گریته:** گرێته، ئەگرێته. (میگیرد)
**گنگن:** گونك گونك، تۆپەڵ تۆپەڵ. (چونه چونه، تکه تکه)
**گوسنەیی:** برسیەتی. (گرسنگی)
**گوڵ مەگەشت:** جێی پڕ لەگوڵ. (گلزار)
**گەرتی:** ئەوی هروئین دەکێشێ. (مُعتاد به هروئین)
**گەردی:** لەتەکیا، لەگەڵیا. (همراهش)
**گەن:** خراو، خراپ. (بد)

**لەوڕە:** لەوێ، لەێنا. (آنجا)
**لەوەر:** لەبەر، بەخاتر. (بخاطر)
**لیردا:** لەێرەدا، لەێرا. (اینجا)

**لیش:** لیٚ، لەئەو. (از او)

**مریت:** ئەمریٚت، دەمریٚ. (می‌میرد)
**مەرافە:** داوا، مەرافعە. (دعوا)
**مەرواتی:** توبیٚژی، توٚدەڵیٚی. (تو گویی)
**مەگیرود:** دەگریٚ، ئەگریٚ. (می‌گیرد)
**مەنو:** مابو. (مانده بود)
**مەنویسود:** دەنوسیٚ، ئەنوسیٚ. (می‌نویسد)
**مینت:** ئەمیٚنیٚ، دەمیٚنیٚ. (می‌ماند)
**مینست:** لە وەدەچو، وادیاربو. (شبیه بود)
**مینیت:** ١. دەمیٚنیٚتەوە؛ ٢. لەوەدەچیٚ. (١. می‌ماند؛ ٢. شبیه است)

**نادرویستی:** بە فرٚوفیٚڵی، پیٚچی. (نادُرُستی)
**نادە:** نیایە. (گذاشت)
**نایدە:** نەیەت، نەیٚت. (نیاید)
**نسمە:** نیمە، نیوە. (نصف، نیمه)
**نویسی:** نوسی. (نوشت)
**نەشناسوم:** نەم شناسیبو. (نشناخته بودم)
**نەکە:** مەکە. (نکن)
**نەمەن:** نەما. (نماند)
**نەمەیود:** نایٚت، نابیت. (نمی‌آید)
**نەمیە:** نەوی لیٚ، گرتیو بەرزی کردەو. (بلندش کرد)
**نەیری:** نیەسی، نیەتی. (ندارد)
**نیامەی:** نامەت، نەگبەتی. (بدشانسی)

**نیەخەفم:** ناخەفم، نانوم (نمی‌خوابم)
**نیەدە:** دەنیٚتە، ئەنیٚتە. (می‌گذارد)
**نیەزانم:** نازانم. (نمی‌دانم)
**نیەو:** ناویٚت. (نمی‌شود)

**وامق:** دڵدادەی عوزرا. (معشوق عَذراءِ)
**وساس:** ویساگە، ڕاوەستاوە. (ایستاده است)

**وساوی:** ویساو، راوەستابو. (ایستاده بود)
**وەت:** وتی، گوتی. (گفت)
**وەتیاد:** ئەیوت، دەیگوت. (می‌گفت)
**وەچکە:** بەچکە، زارۆڵە. (بچه)
**وەگەرد:** لەتەك، لەگەڵ. (با، همراه)
**وەی:** لەئەم، لەبەرئەم. (از این)
**وینەی:** وەك، وەکو. (مانند)

**هایمە:** هاین لە. (هستیم)
**هوچ:** هیچ. (هیچ)
**هەسار:** حەوش. (حیاط)
**هەڵامات:** هەڵمەت. (حمله، یورش)

**یە:** ئەمە. (این)
**یەسە:** ١. خەریکە، وەختە؛ ٢. ئەمەسە. (١. نزدیك است؛ ٢. این است.)
**یەی:** دانێك، دانێ، یەکێك. (یکی)

